

# سەرەتایەک بۆ فێربوونی تەوحید

نوسینی: دایکی ڕێحان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بسم اللّٰه، الصلاة والسلام على رسول اللّٰه وعلى ال و أصحابه و من اهتدى بهدى إما بعد:_

فەرزە لەسەرمان تەوحید بزانین لێرە دا بە ڕونی و بە ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودە شیرینەکان باسی ناوەڕۆکی تەوحید ئەکەم کە دەرم هێناون لە کتێبی جیا جیا و ڕوونیم کردۆتەوە بە تەواوی، بۆ ئەو کەسانەی سەرەتایانە ئەیانەوی تەوحید فێربن، بزانن کە تەوحید حەق و مافی اللّٰه تعالی لەسەر هەموو بەندەیەک، نرخی تەوحید زۆر گران بە هایە لە پێناو گە یا ندنی تەوحید و بەڵاوبونەوەی تەوحید، پێغەمبەران کوژران، زیندانی کران، گاڵتە و وکایەتان پێ کرا، هەمیشە قوربانی ئەدەین بۆ گەیاندنی تەوحید، بۆ ئەوەی خەلک دوور بی لە شیرک و هیچ شتێ نەکەن بە شەریک و هاوبەش و دوور بێت لە دۆزەخ و دەست بگرێت بە پەتی پتەو ئەویش تەوحیدە بەرەو بەهەشتی نەبڕاوەی بلات، داواکارم اللّٰه تعالی هەرچی زیندانیە ئازاد بکات کە لە ژێر گەیاندنی تەوحید لە زیندانن، هەموو موسڵمانی شیفا بدات دڵ و دەرونیان پاک کاتەوە بەرەو دینی پاک، هیوام سوود گەیاندنە بۆتان اللّٰه قبولی کات و ئێوەش آمین لە بیر نەکەن لە دوعاش بێ بەشمان مەکەن.

نوسینی: دایکی ڕیحان

### ❖ لَمَاذا نُدرَس التوحيد..؟

{ئایە ئێمە بۆچی زانستی تەوحید بخوێنین}.؟

پێویستە بیـان خوێنین لەبەر ئەم هۆكارانە:ــ

١ــلأنَّ اللَّه خَلَقنـا من أجلــة

(چونكە اللَّه تعالى لە پێناو ئێمە دروستكردوە)..

بـەلگەیی قورئانی پیرۆز:ــ

(وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) [سورەتی الذاريات:٥٦]

واتە: من هەربۆیە جنۆكەو ئادەمیزادم دروســـتكردووە بمپەرســـتن و عیبادەتم بۆ بكەن.

٢ــ{ لا يقبل اللَّه أي عمــل إلا به }

اللَّه تعالى هیچ كردەوەیەک وەرناگریت ئیلا بە تەوحید نەبێت..

بەلگەیی قورئانی پیرۆز:ــ

(وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ) [سورەتی الزمر:٦٥]

واتە: ســـوێنـد ئـەخۆم كـە بێگومـان وەحی كراوە بۆ تۆ و بۆ ئـەو پەیامبەرانەی بەر لە تۆ بوون، كە ئەگەر گریمان بە هاوبەش قایل ببێت بۆ اللَّه تعالى، ئەوە بێگومان هەموو كردەوەكانت پووچەڵ دەبێ و لە زیانمەندانیش دەبیت

٣_{لا يدخل الجنة إلا موحد}..

ناچێتــە بەهەشت مەگەر تەنهـا موحد نەبێت..

بەلگەیی قورئانی پیرۆز:_

(إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ) [سورەتی المائدة:٧٢]

واته: چاك بزانن كە هەركەسێك شەریك و هاوبەش بۆ اللَّه دابنێ ، بێ شك اللَّه بەهەشتی لەسەر حرام دەكات جێ و شوێنی ئاگرە.

٤_ {سبب لتـكثير الحسنــات}..

تەوحیدی اللَّه تعالى هۆكارێكە بۆ زۆر بوونی چاكەكان..

بەلگەی قورئانی پیرۆز:_

(إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا). [سورەتی النساء:٤٨]

واته: بە تەو بە نەبێ اللَّه لەشـــیرك نابوورێ. بێگو مان هەرگیز اللَّه لەدانانی هاوبەش بۆی نابوورێ و لەخوار شـــیركەوە لەهەر گوناهێك دەبوورێ بۆ هەركەسێك خۆی بیەوێت. وهەر كەسێك هاوبەش بۆ اللَّه دابنێ, بەڕاستیی درۆو گوناهێكی گەورەی كردووە.

٥_{سبب لتكفير السيئــات}.

هۆکارێکە بۆ سرینەوەی تــاوانەکان.

٦_{سبــب للهـداية واستقرار الأمن}.

هـۆکارێکە بۆ هیدایت و بەر قەراربونی ئەمن و ئاسایشی.

بەلگەیی قورئان پیرۆز:_

(ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوٓا إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُولَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ)

[سورەتی الأنعام:٨٢]

واتە: ئەو کەسانەی بڕوایان هێناو، لەهەمان کاتدا ناحەقیی و شیرکیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکرد ، ئاســایش و نەبوونی ترس لەســزای اللَّه هەر بۆ ئەوانە..

٧_{سبـــب للطمأنيـــنـــة}.

هۆکارێکە بۆ دڵنـیــایی دڵ و دامەزراوی.

٨_سبــب لشفاعة النبي ﷺ

(ابو هورەیرە_رضـــی اللَّه عنة _ فەرموویی وتم ئەی پێغەمبەری اللَّه ﷺ کێ بەختەوەرترین کەسە بە تکاو شەفاعەت لە ڕۆژیی دوایدا..؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموویی: بەختەوەرترین کەس لە ڕۆژیی دوای کە بەر تکاو شەفاعەتم ئەکەوێ، کەسێکە کەوا دەڵێیـــت (لا إله إلا اللَّه) بەو پەڕیی نیــاز ئــاکی دلی بە دلێکی پــاک و بێگەردەوە واتە: (هەم لە ناوەڕۆک و واتاکەیی تێبگــات).

■ پێوستە سەرەتا ئەم چوار خاڵـە بزانین و جێبەجێ کەین:

١_{علم} زانست، زانینی ئیسلام
٢_{ عمل }کارکردن ئەم علمەیی کە ئەزانی
٣_{دعوە }بانگــەوازی یەکخواپەرستی
٤_{بر}سەبر و ئارامی لەسەر هەر شتێ کە لەم دینە توشت ئەبێیـت..

سەرەتــا پێناسەیی تەوحید:_

التوحید: ناوێکە بۆ ئەم کردەوانەی ئەنجامی ئەدە یت ئەگەر هەموو کردەوە کا نت بۆ اللّٰە تعالی بوو ئەوە تۆ یەکخواپەرســتی، وە ئەگەر کردەوەکـانـت هەموو بۆ اللّٰە تعـالی نەبوو یـان شرکـت برِیـاردا و مەخلوقت کردە هابەش ، ئــەوە تۆ موشریکیت..

❖جــۆرەکــانی یـەکخواپەرستی {التــوحید}.. سێ جــۆرە:

١_ الربوبیة
٢_الألوهیة
٣_ الأسماء والصفـات

یەکەم : توحیـد (الــربـوبیــة) یـەکخواپەرستی پــەروەردگـاریەتی:
ئەو جۆرەیە کەوا بێ باوەڕەکانی ســـەردەمی پێغەمبەر ﷺ دانیــــــان پێدانــــــاوە، وە پێغەمبەر ﷺ شەڕی لـــەگـــەڵ کردوون، وە نەیشی خستنـە نــاو ئیسلامەوە، وە خـوێن و مــاڵیشـیانی حــەڵال کرد، ئــەوەش بە تـــاک دانانی اللَّه لە کردەوەکانی خۆیدا.
بەلگــەش اللَّه تعالی فەرموویەتی.
(قُل مَن يَـرْزُقُـكُم مِّـنَ السَّـمـَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّــن يَمـلِكُ ٱلسَّمعَ وَٱلۡأَبۡـصَـٰـرَ وَمَـــن يُـخرِجُ ٱلۡـحَيَّ مِنَ ٱلۡـمَيِّـتِ وَيُـخۡـرِجُ ٱلۡمَـيِّـتَ مِنَ ٱلۡـحَيِّ وَمَـن يُـدَبِّـرُ ٱلۡأَمـۡـرَ فَسَيَـقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلۡ أَفَلَا تَتَّقُـونَ)
واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بلێ: کێ هەیە لە ئاســمانەوە (بە هۆیی تیشکی خۆر و بارانەوە) و لە زەویەوە ( بە هۆی خاک و ئاو و هەواوە) ڕزق و ڕۆزیتــان بۆ فەراهــەم بـهێنێـت و پێتــان ببەخشێت، ئەی کێ هەیە خاوەن دەزگاکانی بیستن و بینین بێت (توانایی بیستن و بینینیان پێ ببەخشـــێت). ئەی کێ زیندوو لە مردوو دەر دەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەر دەهێنی هەروەها کێیە هەموو کار و فەرمانەکان جێ بەجێ دەکات و گۆڕانکاریان بەســەر دا دەهێنیت، (لەبەرامبەر ئەم هەموو پرسیارەنەوە) خەلکی ئەلێن: اللَّه ، اللَّه (هەموو ئەم کارەنە و زیاتریش زۆر بە ئاســانی ئەنجام دەدات لە ڕێگایی یاســاو بەرنامەکەی کە هەر خۆیی دایڕشتووە). کەواتە پێییان بلێ: ئایا ناترسن لـە سەرەنجـ ـامی یــاخی بوونتــان، ئــایا ناترسن لە خەشم و قینی اللَّه ؟!

دووەم : توحید (الألــوهیة) یــەکخواپەرستی لــە پــەرستنــدا:ـ
ئــەو جۆرە یەکتاپەرستیەیە کــە کێشەی تێدا کەوتــووە لــە کۆن و ئێستـــــاشدا، بــە تاک دانــــانی اللَّه تعالی لە کردەوەی بەندەکان،، وەکـــــو پـــــاڕانەوە ، شت لەسەر خۆ پەیوەست کردن. نذر قوربانی ، هیوا و ئومید پێبوون، ترس، پشـــت پێ بەســتن، ئومید بە وەلگرتنی پاداشــتی اللَّه ، ترس لە وەرگرتنی سـزایی اللَّه، گـــــــــەڕانەوە،، و هەرجۆرێک لەو جۆرانەش بەڵگـەیان لەسەرە لە قورئان دا..

سێیـــــەم:ـ توحید (الأسمــاء والصفــات)
بـەتـاک دانـا نی اللَّه کە بە هیچ زا تێکی تر نـا چێـت و نـاو و سیفاتەکانیشی:ـ
اللَّه تعالی فەرموویەتی: {قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ (١) ٱللَّهُ ٱلصَّــمَدُ(٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ..
واتـــە;ـئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار بلێ: ئــەو خوای کــە ناوی اللهـیە خوایەکی تاک و تەنهــایە ( بێ هاوەڵ و هاوتایە) خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییــە و هەموویـــــان ئاتاجی ئـــــــەون ، هەر ئەو ئەتوانی بەڵاو ناخۆ شی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێ بەجی بکـات، هیچ کــەسێ لێ نەبووە و خۆشی لە کەس نەبووە ، هەرگیز هاوتاو هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییـــە کە لەبەرامبەریەوە بەوەستێت و هاوشانی بێیت.

{وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} (الأعراف : ١٨٠)

واته: هەر بۆ اللَّه یە هەموو نـاوە جوان و پیرۆزەکـان، جـا ئەی (ئیماندااران) بـــەم ناوانە دوعا و نزا بکەن و هانا و هاوار بۆ ئەم زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزە کانی اللَّه تعالی لادان ئەکەن ، ســیفەت و ناوەکانی اللَّه تعالی بە کار دێن بۆ غەیری اللَّه ، لە ئایندە دا پاداشــتی ئەم کارو کردەوانەیان وەل ئەگرن کە ئەنجامیان ئەدا.

(لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ} [الشورى : ١١]

واتـــە ؛هیچ شتێک نییە لە وێنەی ئـــەم زاتە ، هیچ شتێک لـــەو ناچێیـــت (چـــونکـە اللَّه و بەدیهێنەرە، چـــۆن لـــە بەدیهێنراوەکانی دەچێیـــت، هەر ئەویش بیسەر و بینایە..

دوو بــەشەکەی {لا إلـه إلا اللَّه }
(فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّغُوتِ وَيُؤْمِن بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ)البقره (٢٥٦). واتەکەیی: {فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّغُوتِ}ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە تاغوت نەبێت، دیارە تاغووت ئەو کەسەیە کە لە سنووری خوا دەرچێ و، بەرنامە چەوتەکان قبووڵ کا، جا هەرکەس خۆی لەو جۆرە شتانە دوورگرت {وَيُؤْمِن بِٱللَّهِ} و باوەڕی بەخوا هێنا، { فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ )..
ئەوە بێگومانە دەستی بە پەتێکی پتەوو قایمەوە گرتووە.

تێبینی: زۆرێک لە زا نا یان ئەلێن مەبەستی اللَّه تعالى لە { بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ} (لا إله إلا اللَّه)ـیە کە ئـەم ئایەتە ئەبێ بە دوو بەش ئیستا ڕونی ئەکەمەوە
(لا إله إلا اللَّه)..
١_(لا إله) نفي کفرکردن بە هەر پێنج جۆرە طاغوتەکە بە کورتی باسی ئەکەین.
١_ابلیس(شەیطان)
٢_هەر کەس بانگەوازی زانستی غەیب بکات.
٣_هەر شەریعەتی خەیری شەریعەتی ئیسلام.
٤_هەر دەسەلاتدارێ ئەگەر بە شەریعەتی اللَّه حوکم نەکات.
٥_هەر کەس بانگەشەی پەرستن بۆ خۆیی بکات.

تێبینی/ هەر کەســـی یەک لەوانە بڕوای پێ هەبێت و خۆی لێ بەری نەکات لە دین دەر ئەچێت کە باسی ئەکەم دوای ئەوانـە بە بەڵگـە.

٢_(إلا اللَّه) أثبــات_واتــە بڕوا بوون بە اللَّه تعالی.

کە ئەلێین (إلا اللَّه) اثباتی هەموو ئەم شـــتانە ئەکەین کە پێی ئەچینە ناو دینی ئیسلام.

ئەویش وەک بنەماکان

١_ئیسلام

٢_ئیمـــان

٣_ احســـان

١/ئیسلام..

١_ شەهادە:کە پێ ئەچیە ناو دینی ئیسلام کە بزانی شایدی ئەدەم کە اللَّه تعالی شایەنی پەرستنە بە حەق و محمد ﷺ نێرداوی اللَّهیە.

٢_ نوێژکردن

٣_بە ڕۆژوو بیت

٤_زەکات دان

٥_حەج کردن ئەگەر لە توانات بوو

٢/ئیـــمان

١ـبڕوا بون بە اللَّه تعالی

٢ـبڕوا بون بە پێغەمبەران

٣ـبڕوا بون بە فریشتەکان

٤ـبڕوا بون بە کتێبەکان

٥ـبڕوا بون بە قەزاو قەدەر

٦ـبڕوا بوون بە ڕۆژیی دوایی

٣/احسان

احسان:ـ واتــە ئەوهـا اللَّه تعالی بپەرستی وەک ئەوەیی ئەی بینی ، چونکە ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئــەو تۆ ئەبینێ..

❖ ئیســتــا ئـەبێ تێبگــەین کە (لا إله) بێ (إلا اللَّه) نابێت وە بە پێچەوانەشەوە هەردووک پێکەوەیە.

ئینجــا زۆر خەلک ئەبینی بەشی لا إلــە هەیە و وازی لە بەشـی إلا اللَّه هێناوە، توحیدەکەی تەواو نیە ئەمە موســلمان نیەو لە دین دەر ئەچێت پەنا بە اللَّه ، ئـــــەبی نەفی هەموو طافوتەکان بکات و اثباتی بنەماکان بکات، ئینجا دەستــی گرتووە بەم پەتــە پتەوە کە تەوحیدە چەند توند ئــەم پەتا بگری زیاتر اللَّه تعالی لێی ڕازێ ئەبێت، پێویستە وا توند دەستی پێ گرین هەرگیز نەپچڕێت..

(لا إله)_نفي _ كفركردن بە هەر پێنج جۆرە طاغوتەكە بەلگە باسـی ئەكەین:_

١_ابلیس(شەیطان)

٢_هەر كەس بانگەوازی زانستی غەیب بكات.

٣_هەر شەریعەتی خەیری شەریعەتی ئیسلام.

٤_هەر دەسەلاتداری (دادوەری ) ئـەگەر بە شەریعەتی طاغوت حوكم بكات.

٥_هەر كەس بانگەشەی پەرستن بۆ خۆیی بكات.

جۆرەكانی طاغوت كە اللَّه تعالی لە قورئان باسی كـردوون:_

لە دوای ئەوەی لە بەشی پێشتردا زانیامان مانای وشەی طاغوت چییە ئێستەش با بزانین اللَّه تعالی لە كتێبەكەیدا چ شتێک بە طاغوت دەزانێت، اللَّه تعالی لە قورئاندا باسی كۆمەڵێک شتمان بۆ باس ئەكات كە طـاغوتن و ئەبێ موسولمان بیانناسێت و نەفیان بكات یانی لێیان دوور كەوێتەوە ئەویش ئەوانـەن:_

١-شـەیتان: شەیتان سەرۆكی هەموو طاغوتەكانە، مەبەستیش لە شـەیتان تەنها ئیبلیس ناگرێتەوە، بەڵكو اللَّه تعالی لە {سـورەتی أنعام ئایەتی ١١٢} {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ }كە لەم ئـایەتە اللَّه تعـالی پێمان ئەفەرموویـت

شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە بوونیان هەیە،بەڵگەش لەسەر طاغوت بوونی شـــەیتانەکان ئەوەیە کە اللَّه تعالی فەرموو {أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ } يس ٦٠
واتە: مەگەر پەیامنم لێتان وەرنەگرت ئەی نەوەکانی ئادەم کەوا شەیتان نەپەرسنت؟ بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە.

٢_هەر کەســێک کە بانگەوازی زانســتی غەیب بکات: حەمتەن هەر کەســێک ئەگەر بڵێت من ئەزانم لە داهاتوودا چی دەبێت، یاخود بە خەڵک بڵێت ئەگەر ئاوابکەن ئەوا ئەم شــتە ڕوودەدات و ئەگەریش ئاوابکەن ئەوا ئەم شــتە ڕوودەدات ، ئەوا ئەو کەســە طـــــاغوتە و بـانگەشـــەی غەیبی کردووە،گومـان لەوە نییە کە تەنهـا اللَّه تعـالی ئاگاداری غەیبە، هەروەک فەرموویەتی: {عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا}سورەتی الجن ئایەتی ٢٦
واتە: اللَّه تعالی زا نای غەیبە و کەســیش ناتوانێ پەردە لەســەر غەیبیاتەکانی لابەرێت ، تەواو کە فەرمووی کەس ناتوانی ئیتر پێیوست ناکات بیانوو بهێنرێتەوە وەک بلێن ئامێری پێشــکەوت و بۆ زانینی غەیب و ئەم شــتانە، نەخێر تەنها اللَّه تعالی بە غەیب ئەزانی هیچ کەس و هیچ شتێ ناتوانی... و اللَّه أعــلم

ئەتوانین بڵێین وەک ســـاحیر و  فاڵچی و بریتین لە دوو نمونەی ڕون لەســەر ئەم تاغوتە (غەیب)چونکە هەموویان بانگەشــەی ئەوە ئەکەن کە گوایە شتانێک ئەزانن  کە هێشتا ڕوویندەداوە.

هەروەها بە یەقین و دڵنیاییەوە باســی ئەکەن، هەر کەســێک باوەڕی وابێت کەوا ئەم طاغوتانە قسـەکانیان ڕاسـتە ئەوا ئەویش وەکو ئەوان کافرە، هەرکەســێکیش باوەڕیان پێنەکات کەچی ســەردانیان بکات و گوێیان لێ بگرێت ئەوا تا ٤٠ ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت. بەڵگەش بریتییە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک فەرمووی: (من أتى كاهنا فصدقه مبا يقول فقد كفر مبا أنزل على محمد) واتە: هەر چ کە سێک سەردانی کاهینێک بکات و قسەکانی بە ڕاست دابنێت ئەوا کافر بووە بەو کتێبەی کەوا لەسەر محمد دابەزیوە.

تێبینی١: کاهین ئەو کەســـەیە کە  باســـی داهاتوو ئەکات و ئەڵێت لە داهاتوودا فڵانـە شت ڕووئەدات.

٣- هەر شــەریعەتێک لە غەیری شــەریعەتی ئیســلام: یەکێکی تر لەو جۆرانەی طاغوت کە اللَّه تعالى لە قورئاندا باســی کردوون، بریتییە لە تاغوتی {شــەریعەت}، واتە هەر شــەریعەتێک لە غەیری شــەریعەتی ئیسلام بێت.

وەک اللَّه تعالی فەرموویەتی: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا } سورەتی النساء ئایەتی٦٠

واتــە: ئــەی محمد، مەگەر ئەو کەسانەت نەبینیوە کە بانگەشە ئەکەن گوایە باوەڕ یان بەو کتێبە هەیە کە بۆ تۆ دابەزیوە و هەروە ها گوایە باوەڕیان بەو کتێبانەی پێشرـــتیش، کەچی لە هەمان کاتدا ئەیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای طاغوت لە کاتێکدا فەرمانیان پێکراوە تا کوفری پێ بکەن، ئینجا لەم ئایەتەدا اللَّه تعالی کوفری ئەو کەسانەمان بۆ ئاشــکرا ئەکات کە خۆیان وا پیشـــان دەدەن گوایە موســولمانن، کەچی دەیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای شــەریعەتێکی طاغوت لە غەیری شەریعەتی ئیسلام، نمونەش شەریعەتە طاغوتییەکان زۆرن، وەکو دیمو کراســیەت و عەلمانیەت و شــووعیەت و چەندهای تر، هەریەک لەم شــەریعەتانە خاوەنی کۆمەڵێک بنچینە و بنەمان کە زۆر جیاوازە لەگەڵ بنچینەکانی ئیســلام. هەر کەسـێک باوەڕی بە یەکێک لەم شــەریعەتە طاغوتانە هەبێت ئەوا بەڵگەیە لەســەر ئەوەی ئەم شەخصە کوفری بە طاغوت نەکردووە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم شەخصە درۆ ئەکات ئەگەر گووتبێتی من موسوڵمانم..!!

لەڕا ستیدا ئەو کە سە ئەهلی طاغوتە نەک ئەهلی تەوحید، بەڵام خۆی پێ موسڵمانە کەچی خۆی خودی طــــاغوتە وەک حزبە ئیسلامیەکان

خۆیـان خوودی طـاغوتەکەن بەڵام بە نـاو ئیسـلامین مرۆڤ هەل ئەخەلەتێن بە ناوی ئیســلام ئەگەرنـــــا طاغوتن و دوور لە حوکمی قورئانن.

٤_هەر دەســەلاتدار و دادوەرێیک ئەگەر بە شــەریعەتێکی طاغوت حوکم بدەن:
ئەم دوو کە سەش ئەبن بە طاغوت، بۆ نموونە:_دە سەلاتدارێک بڕیار ئەدات بەوەی شــەریعەتێکی طاغوت بکرێت بە حاکم بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و خەڵکەکە، یاخود هەر دادوەرێک ئەگەر کێشــەیەک بهێنرێتە لای و ئەویش بە شەریعەت و یاسایە طاغوتییەکان کێشەکە چارەسەر بکات لەبری شــەریعەتی ئیســلام ئەوا لەو حاڵەتەدا جگە لەوەی کە شــەریعەتەکە طاغوتە، لەهەمان کاتیشــدا حاکم و دەســەلاتدارەکەش ئەبن بە طاغوت. بەڵگەش بریتییە لە هە مان ئایەتی خاڵی ســێیەم، دووبارە هەمان ئایەت ئەکرێتەوە بـەڵگـە. لەگەڵ ئایەتێکی تریش کە اللَّه تعالى دەفەرموو یت: {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} ســورەتی المائدە ئایەتی ٤٤ واتە:_هەر کەســێک حوکم بەوە نە کات کە اللَّه تعالى دایبەزا ندووە ئەوا ئەو کەســانە کافرن. هۆکاری کافر بوونەکە لەبەر ئەوەیە کە ئەم شەخصە بە شەریعەتێکی طاغوت، وەکو دیموکراســیەت حوکم ئەدات و حوکمڕانیی ئە کات، کەواتە ئەو کەســە تەوحیدی تێدا نییە و کوفری بە طاغوت نەکردووە،

وەک ئیستا ئەبینی هیچ حوکـــم بە قورئان ناکرێت بەڵام ئـــەم خەلکە هەر خەریکی کوفر کردنـــە ، گەر قورئانیان پشت گوێ نەختستبا گەر پەتی تەوحیدیان توند گرتبا بإذن اللَّه تعالى ئیســـتا هەموو شـــتیان ئەزانی دوور بوون لە شرک.

٥_هەر کەسێک بانگەشەی پەرستن بۆ خۆی بکات: حەتمەن ئەمەش جۆرێکی تری طاغوتە کە الله تعالى لە قورئان باســـی ئەکات هەر کەســێک خەڵک هان بدات بۆ ئەوەی بیپەرســتن و لێی بپاڕێنەوە ئەوا ئەو کەســـە تەنها کافر نییە بەڵکو طاغوتیشـــە، پۆلی طاغوتەکەشـــی بریتییە لە معبود بەڵگەش کە اللَّه تعالى دەفەرمووێت: {وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ}ســـوڕەتی الإنبياء ئایەتی٢٩

واتـــە:_جا هەر کەسێک لەوان بڵێت من شایەنی پەرستنم لە غەیری اللَّه تعالى ئەوا ئێمەش بە دۆزەخ پاداشـــتی دەدەینەوە، ئاوا پاداشـــتی ستەمکاران دەدەینەوە.

حەتمەن ئەگەر کە سێک بپەرسرتێت لەکاتێکدا بەخۆی ڕازی نییە ئەوا پێی ناگووترێ طاغوت، کەسێک یەکێک لەم خاڵانەی لەسەر جێبەجێ ببێت ئەوا هەرگیز موەحید نییە و موسوڵمان نییە،ئەگەر چی بشڵێت من موســـوڵمانم، هەروەها نوێژ و شـــەونوێژیش بکات هیچی لێ قەبوڵ ناکرێت، چونکە تەوحیدی تێدا نییە و ئەهلی طاغوتە.

تێبینی٢ // ئینجا بـۆ زیاتر تێگەیشتن سەبارەت بە حوکمی طاغوتانە بە کورتی باســی دارالإســلام و دار الکفر ئەکەم، کە ئیســتا حوکمی دار الکفر پەیرەو ئەکرێ لێرە..وللە اعلم

١ _ سـەرەتـا ( دار الإسـلام ) بـەو نـاوچـەیـە ئـەوتـرێـت کە (حـوکمی شـەرع) تـێیدا جـێـبـەجـێ دەکرێت و شعائر ـی ئیسلام تێیدا دیـار و ئـاشـکـرایـە ، حـوکمی قورئـان و سونـەت تیادا جێبەجـــێ ئەکرێت مـــاڵی کۆچ و سونـــەتە ئـــەم شارەی حوکمی (دار الإســلامی) تێدا جێبەجێ ئەکرێت، لە هەموو شــتێکا حوکمی قورئــان ئەکرێت.

٢ _(دار الکفر) بـە پـێـچـەوانـەوە بـەو نـاوچـەیـە ئـەوتـرێـت کە (حـوکـمی شـەرع)ـتێیدا جـێـبـەجـێ نـاکـرێـت و شـعائر ـی ئیسلام تێیدا دیــار و ئـاشکرا نـیـیە ، وەک ئـەوەی تێیادا ئەژین وڵاتێک پـڕ لــە شرک و کوفر دوور لە حوکمی قورئان اللّە تعالی پەنــامان بات.

مەرجــەكانی { لا إله إلا اللَّه }

یـ ـ ـەكەم:_{ العلم } زانست و زانیاری پێی ، یانی زانست و زانیاریت هەبێت خۆت شارەزا بكەیت سەبارەت بەم { لا إله إلا اللَّه}.
بـ ـەلگـ ـەی زانست:_ اللَّه تعالی دەفەرموویت: {فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ} ســـورەتی محمد ئایەتی ١٩واتە: باش بزانە كـــــەوا هیچ پەرستراوێک نیە بە حـــەق شیـاوی پەرستـــن بێـــت تەنهـــا اللَّه نەبێ.) وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ( من مات وهو يعلم انه لا اله الا الله دخل الجنة ) رواه مسلم واته : ( هەر كەسێ بمرێ وە بشزانێ كە هیچ پەرستـراوێک نیە شـایانی پەرستن بێت بە حەق جگە لە الله ئەوە ئەچێتە بەهەشتەوە )

تێبینی// بـە ناوەڕۆک و بە ملكەچی و بە كردار و بە نیازپاكی ـیـەوە ئینجا ئەچێتە بەهەشت..ولله أعـلـم

دووەم:_{ اليــقيـــن} دڵنیـــابوون تیایــدا، تــەواو زانیــاری بـوون تیـ ـایدا، و نـ ـەمانی گوومان تیـ ـایدا، هیچ گومانت نەبێ سەبارەت بەم{ لا إله إلا اللَّه } ـیـە هەر شتی هات لەمە وەریگریت بێ دوو دڵی و گوومان و بــــەلگـــەكەیی..
اللَّه تعالی :_ئەفەرموێ : ( إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا )سورەتی الحجرات ئایەتی١٥ واتە : ( بە تەئكید بڕواداڕانی

ڕاســـتەقینە ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ پاشان شک و گومان و دوو دڵیان نیە لە بڕواکەیان ) ، وە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ : ( أشــهـد أن لا إله إلا اللَّه ، وأنى رســول اللَّه لا يلقي اللَّه بهما عبد غير شاك فهمـا ، إلا دخـل الجنة ) واتە : ( شاهێدی ئەدەم بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللَّه وە شـــاهێـدی ئەدەم من نێردراوی خوام هەر بەنـدەیەک بەو شـــاهێدیە بگات بە خوا کە گومان و دوو دڵ نەبوبێ لێی ، ئەوە دوور ناخرێتەوەو ڕێی لێ ناگیرێ لە بەهەشت ).

سێیـــەم:ـ {الإخلاص } نیــاز پـاکی و دڵســۆزی (تەنهــا اللَّه پێ مەبەست بوون) نـەمانی هاوبەش پەیداکردن تیـ ـایدا، بە نیازپاکی و دڵسۆزی ئــەم{ لا إله إلا اللَّه }ــیە جێ بەجی بکەیت و تەنها بۆ اللَّه دوور لە ریا و دوور لەوەی بۆ خەلکی مەبەســت بێت تەنها اللَّه تعالى ــت مەبەست بێت.

بــەلگەکەیی...

{ألا للَّه الدين الخـالص}

واتە: ئــاگــاداربن دینی پاک و خــاوێن تەنها بۆ اللَّه

چوارەم:ـ {الصــدق } ڕاستگــــۆیی ، نــەمانی درۆکردن تیایدا، بــە ڕاستگۆی بە دڵ و بە زمان و کردار ڕاستگۆ بە بەرامبەری،

بەلگـــەکەی..

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت : (ما من احد يـشهد ان لا اله الا اللَّه ، وان محمدا عبده ورسوله صادقا من قلبه إلا حرمه اللَّه على النار ) واته : ( هەر کەسێک شاهێدی بدا بەوەی کە هیچ پەرستراوێک نیە شایەنی پەرســتن بێت بە حەق جگە لە اللَّه ، وە شــاهێدی بدا بەوەی کە موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە بە ڕاســتگۆیی لە دڵیەوە ئیلا اللَّه تعالی حەرامی ئەکا لە سەری بچیتە ئاگر ) .

پێنجــەم:ـ{ المحـــبـــة }خۆشەویستی بۆ ئەم وشەیە، وە خۆشەویستی بۆ ئەم شتانەی کە بەلگەن لەسەر ئەم وشە ، و دڵخۆش بوون بەمە، وە خۆشەویستی ئەم کەسانەی کە {لا إله إلا اللَّه}ـی پەیرەو ئەکەن.

بەلگەکەی..

اللَّه تعالی دەفەرموویت : ( وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَــدُّ حُبّاً لِّلّهِ)البقره ١٦٥واته:ـ لەگەڵ ئەو هەموو بەلگە ئا شکرایانە دا هەندێک کەس هەیە لە جیاتی ئەوەی خواپەرســت ببێت ، شــتانی تر دادەتاشــی بۆ خۆیی و شــوێن ڕێنماییەکانی اللَّه تعالی ناکەویت خۆشــەویســتی و سـۆزی دەدات بەم بەرنامۆلکە و توولە ڕێگەیانە و خوشــی دەوین، وەک چۆن ئیماندارانی اللَّه تعالی یان خۆشەویت، بــەڵام ئەوانەی ئیمان و باوڕیان هێناوە زۆر زیاتر اللَّه تعالی یان خۆشەویت (هەر بەراورت ناکریت ).

شەشەم:ـ{ الأنــقــيــاد } ملــكەچ بوون بۆ مافەكانی ، ئەوەش كردەوە واجبەكانن، اللَّه پێ مەبەســت بون و نیاز پاكی، بۆ ڕەزامەندی اللَّه تعالی.

بەلگەكەیی..

اللَّه تعالی دەفەرموو يت: (وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْــلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُـونَ) الزمر ئایەتی ٥٤ واتە : ( وە بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیم و ملكەچی فەرمانەكانی بن).

حەوتەم: { القبــــول } قبولبوون ، نەمانی ڕەتكردنەوە، قبولی بــكەیت هەر شتی لەم{ لا إله إلا اللَّه}یە ملكەچ بی بەرامبەری و قبولی كەیت.

بەلگـــــەكەیی.. الله تعالی دەفەرموويت:ـ( إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْــتَكْبِرُونَ . وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَــاعِرٍ مَّجْنُون ) سورەتی صافات ئایەتی٣٦ واتە : ( ئەوان كە پێیان ئەوترێ بلێن لا اله الا اللَّه خۆ بەگەورە ئەزانن لەوەی بیلێن وە ئەلێن یـا نی ئێمە پەرســتراوەكانی–بتەكانی- خۆمان واز لێ بێنین بۆ شــاعیرێكی شـێت ـمەبەستیان پێغەمبەرەﷺ بوو.

## ❖ئــایـه هەڵـوەشێنـەرەوەکانی ئیسلام چین..؟

_بـەـریـتـیـیـه لــه پـــوچـــەڵ کەرەوەکانی ئیـسلام و ئـەوەی لــه ئیسلام دەری دەکات بــۆ کوفری گـــەورە، وە ئیســلامیش بریتـیـیـه لــە :تـەسلـیـم بـــوون بـــۆ خـوای گـــەورە بـە تـــەوحـیـد و مـلکـەچبوون بـۆی به گـــوێڕایـەڵی و بەریبوون لـــە شـــیرک و مـــوشـــریکـــەکان.

~ مـــانـــاکەی واتـــە ئـەو شـــتـانـەی کە مـــوسڵـــمـان لـــە ئیـــسلامـــەوە دەردەکـــات بـــۆ کوفری گـــەورە، داوا لـــە خوا دەکەین بمـــانپـــارێزی و ســـەڵامەتمـــان بـــکـات.

~ئـــایـە ئـــەم هـــەڵوەشێنەرەوانە یـەک دەنـــگـی زانـــایـــانی لـــەسەرە ؟

{بــــــەڵێ }

~ ئـــایه سـنـووردار کراوە بـــە ژمـــارەیەکی دیـــاری کراو ؟

{ نـــەخێـر سنووردار نییـه }

ئـــەی بـــۆ فـەرموویەتی دە دانـــەیه ..؟

واتـە:_ لـــە هـەمـوویـان تـــرسنـــاکترن و بـــۆ ئـەوەی لـــەبەر بکرێت.

{هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیســـلام}

بـــاس ئەكەین:ـ

یــەكەم هەلوەشێنەرەوە:ـ هاوبەش بڕیاردان بۆ اللَّه تعالى لە پەرستنی دا..

اللَّه تعالى دەفەرموویت:ـ( إِنَّ ٱللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ افْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا) سوڕەتی النساء ئایەتی ٤٨

واتــە:ـ بــە ڕاستی اللَّه تعالى خۆش نابێت لەوەی هاوەڵ و شەریكی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو هاوبەش دانانە لە گوناهانی تر بۆ هەر كەس بیەوێت و شایستە بێت و پەشیمان بێت خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ اللَّه تعالى بڕیار بدات، ئەوە بە ڕاستی گومرا بوە بە گومرایكی زۆر دوور.

شیركــی گــەورە

ـ حــەقیــقەتەكەشی بــەو شێوەیــە كەوا كەسەكە بـــاوەڕی وابێت جگــە لــە خوای گــەورە تــەصەروفێكی شـــاراوەی هەیە لـــــە گــەردووندا یان بـــــە دەستهـــێنـــانی قـــازانجـــــەكان یـــــان دوورخستنــەوەی زیـــانـەكانی بـە دەسته.

١_ خــاوەنـەکەی لــە ئیســلام دەردەکات.
٢_ هـەموو کردەوەکان پووچـەڵ دەکاتەوە.
٣_خــوێن و ماڵی حەڵاڵ دەکـات لـە لایەن دەسەڵاتدارەوە.
٤_ خــاوەنـەکەی بۆ هـەتا هـەتایی لـە ئـاگردا دەهێڵــتـەوە.
٥_ ئـەگـەر هـاتوو لـە شەرعدا بـە گـەورە (الأکبـر) نــاوی برا شیــرکی بچـووک

_ حـــــەقیـــقەتـــەکەشی ئەوەیـــە کەوا ئـــــەوەی خوای گـــەورە نەیکـردووەتە هـۆکاری ئـەم بـــە هـۆکـاری بـزانێت ، وە هـەر شتـێـک وەسیلـــەیـەک بـێت بـۆ شیرکی گـەورە ئــەوا شیـرکـی بچـووکە.
١_خــاوەنەکەی لــە ئیسلام دەرنــاکات.
٢_تـەنـهـا کردەوەی تــایبەت پووچـەڵ دەکاتەوە.
٣_خوێن و مـاڵی حەڵاڵ نــابێت.
٤_خــاوەنــەکەی بۆ هـــەتا هـــەتایی لـــە ئــاگردا ناهێــلـێتەوە.
٥_ ئـەگـەر هــاتوو لــە شەرعـدا بـە( الاصغر ) نـاوی برا

دووەم هەلوەشـــێنەرەوە:ـ هەر کەســێک لە نێوان خۆی و اللَّه تعالی وا ستە دابنێت، و لێیـــــان بپارێتەوە و داوای شەفاعەتیان لێ بکات، پشتیـــــان پێ ببەستێت، بە یەک دەنگی زانایان کافرە ( لە ئیسلام دەر ئەچێت )..

بـــەشـــەکانی شـــەفـاعـەت

~ ئـەوەی کــە دروستــکراو لــە تـوانــایدایـە ، دروستـە بــە چـوار مەرج...

١ـدەبێـــت ئـــامادە بێـت.

٢ـزیـــندوو بێـت.

٣ـتـــوانـای لـــەسەر هەبێت.

٤ـبـڕوای وابێـت کە تەنها هـۆکارە.

~ ئــەوەی کـە هـیـچ کەس توانای لــەسەر نیـیـە تـەنهــا خـوا نـەبـێـت.

ـ ئــەوەی سەلمێنراوە : ئـەوەیـە کە خوای گــەورە بـۆ خــۆیی سەلماندویەتی و لــە ـ هـیـچ کەسێک داوا نــاکرێت تـەنهـا لـەو نـەبێت

چـــەند مەرجێکی تێدایە..

١ـ مۆلــەت دانی خوای گــەورە بــەم شەفاعــەتە.
٢ـ ڕازی بێت لــەو کەسـەی شــەفاعەت دەکات.
٣ـڕازی بێت لــەو کەسەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت.

سێیـــــــــــــەم هەلوەشێنەرەوە:ـ هەر کەسێک موشریکەکان بە کافر نەزانێت یان گومانی لە کافر بونیان هەبێت یان ڕێبــازەکەیان بە ڕاست بزانێت، ئەوە پێی لە دین ئەچێتە دەرەوە

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت:ـ{والذي نفس محمد بيدة لا يـسمع بي أحد مج هذه الامـة يهودي ولا نصرانـي ثـم يمـوت ولـم يؤمن بالذي أرسلـت به إلا كان من أصـحـاب النـار} واتــە:ـ سوێند بەو خوایەی گیـانی محمدی بە دەستە هیچ کەسێک لـەم ئومەتـە جولەکە بێی یان گــاور پەیامەکـەی من ببیستێت و باوەر نەهێنێت بەوەی من هێناومە ئیـلا دەبێتـە ئەهلـی دۆزەخ

بەلگەش ئایەتی اللَّه تعالى دەفەرمووێت: { وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ} أل عمران ئایەتی ٨٥ واتە: هەر کەسێک بێجگـە لە بەرنامە و شەریعەتی ئیسلام هەر دینێک بۆ خۆی هەڵبـــژێرێ و بیکــا بە بـــەرنــامەی خـــۆی هەرگیز لێیوەرناگیری و لە دواڕۆژیشدا لە ڕیزی زەرەرمەندان دایە.

چوارەم هەلوەشـــێنەرەوە:ـ هەر کەســێک باوڕی وابێت کەوا ڕێبازی جگە لە پێغەمبەر ﷺ باشــترە لە ڕێبازی ئەو ، یان پێی وابێت حوکمێکی تر باشــترە لە حوکمی ئەو ، وەک ئەو کەســەی حوکمی طاغوتەکان بە باشــتر ئەزانی بەســەر حوکمی پێغەمبەر ﷺ ئەوا کـــافرە

ـبـەوەی حوکمی طـاغوتەکان و یاساکان پێش حوکمی الله بخات و بلێت حوکمی قورئان بۆ ئەم ســەردەمە نابێت، ئەوە کوفری گەورەیە و پێی کافر ئەبێت اللَّه تعالی دەفەرمووێت:ـ{ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ }سورەتی التوبە ئایەتی٣١

واتــە:ـ لەبری خــوای گەورە مەلا و ڕەبەنەکانی خۆیـان کردە خــوا.

پێنجــــــەم هەلوەشێنەرەوە:ـ هەر کەسێک ڕقی لە شتێک بێتەوە کە لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە ، هەر چەند خۆشــی کاری پێ بکات هەر کافر ئەبێت..

وەک اللَّه تعالی دەفەرمووێت:ـ { ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ}سورەتی محمد ئایەتی ٩

واتـــە:ـ ئا ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە بێگـومـان ئەوان ڕقیان لە قورئـان بۆتەوە وە حەزیان لە بەرنامەی اللَّه تعالی نەبوو جا اللَّه تعالی کارو کردەوەکانی پووچ کردنەوە.

هەروەها دەفەرموویت: {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا}سورەتی النساء ئایەتی٦٥

واتە: ئەی محمدﷺ سوێند بێ بە پەروەردگارت ئیمان ناهێنن تا تۆ نەکەنە حاکم و دادوەر لەو ناکۆکیانەی کە لە نێوانیان دا ڕوودەدات پاشان کە تۆ بڕیارد دا لە نێوانیان نابێ لە نەفس و ناخیشیاندا هیچ پێ ناخۆش بوونێک هەبێت لەم بڕیارەی کە تۆ داوتە، ئەبێ لە ناخی دڵیان پێ ڕازی بن و دڵیان پێی خۆ شبێت، خۆیان تە سلیم بکەن بەم بڕیارەی تۆ تەسلیم بونێکی تەواو بەبێ ڕەتکردنەوە.

شە شەم هەلوە شێنەرەوە:ـ هەر کە سێک سوکایەتی و گاڵتە بە شتێ بکات لە دینی پێغەمبەر ﷺ یان گاڵتە بە پاداشتێکی بکات یان بە سزایەکی، ئەوە پێی کافر ئەبێت وەک اللّه تعالی دەفەرموویت:ـ{ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ( ٦٥ ) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ}سورەتی التوبە ئایەتی٦٥ـ٦٦

واتە:ـ پێیان بلێ ئایا گاڵتەتان بەخواو ئایەتەکانی و بە پێغەمبەرەکەیﷺ کردبوو(٦٥) بلێ بڕوبیانووی بێجی مەهێننەوە، چونکە پاش ئەوە باوەڕتان هێنا، کافربوونەوە.

حەوتــەم هەلوەشێنەرەوە:ـ سیحر و جــادو ، بەشێک لە سحر لێک کردن و خۆشەویستی دروستکردنە، هەر کەسێک کردی یان پێی ڕازی بوو ئەمە کافرە

{سیــحر ( جــادوو ) }

ـ حــوکمەکەی :ـ جــادوو کـوفــری گــەورەیە ، بــە بـەڵگــەی ئــەو ئــایـەتـەی کـە خـوای گــەورە دەفەرموویّت: ( وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ )

ـنیــشـانـەکانی جــادووبـاز (ســاحیـر)

١- جـ ـ ـیـ ـ ـاوازی لـ ـەگـ ـەڵ مەرجـ ـە ڕێگـ ـە پێدراوەکانی ڕوقیـ ـەی شەرعی یانی جیایە لە ڕوقیە شەرعیە.

٢ـ نــــوسینی چــەند پیتــێکی پچــڕ پچــڕ ، وە قســـــەکردن بـــ ـە قســـەکردنێک لـێـی تـێـنـاگـەین.

٣ـ تەمــاشـا کردنی ئەستێرەکان ( علبم التـأثیـر ). خـوێندنەوەی ناو دەست و فنــجــان.

٤ـ گــرێـدان لــەگەڵ فووکردنـدا.

٥ـ لــە یـەک جیـاکردنەوە و سـۆزداری ( لـە یەک نـزیک کردنەوە)

٦ـ فەرمان بکات بــە نــەخـۆشەکە بـە ئـەنجـامدانی سـەرپێچییەکی شـەرعی وەکو ئــەنجــامدانی کارێکی حــەرام یـان وازهێـنـان لــە نــوێژ یــان وازهـێـنــان لـە ( بســم اللَّه ) لــە کاتی سـەربـڕیـنی ئــاژەڵــدا.

٧ـ پــرسـیاری نــاوی دایک بکات.
٨ـ بـانگــەشەی زانـینی عـیلمی غـەیب بکـات.
هە شتەم هەلوە شێنەرەوە:ـ سەرخستن و یارمەتی دانی موشریکەکان بەســەر موســڵمانـان دا بەلگەش ئەم ئـایەتەیە کە ا للَّه تعـا لی فەرموویەتی:ـ{ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ}سورەتی المائدە ئایەتی ٥١
واتـە:ـ وە هەر کەسێکیشتان دۆستایەتییان لەگەڵ بکات، و بیـانکات بــە یارمــەتیدەر و دۆستی خــۆی، وە یان هاوکاریی و هاوڕێییـــان بکات، بێ شک ئەو کەست هەر لەوانــــە و بەوان دا دەنرێت، ئەگەر چی بە ناســنامەش موســڵمان بێت بێگوومان اللَّه هیدایەت و ڕێنمایی گەڵی ناهەق و ستەمکار نــاکات.
نۆیەم :ـ هەر کەســێک بڕوای وابێت کەوا هەندێک لە خەڵک بۆیان هەیە دەربچن لە شــەریعەت و ڕێبازی محمد ﷺ هەر وەک چۆن (خضر) علیه السلام.... بۆی هەبوو دەرچێت لە شەریعەتی موسا علیه السلام. ئەوە کافرە.
وەک اللَّه تعالی دەفەرمووێت:ـ{ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُــولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا }سورەتی الأعراف ئایەتی١٥٨
واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بلێ: ئەی خەڵکینە، چـاک بزانن کە من پەیامبەرو نێردراوی خوام بۆ لای ســەرجەم ئێوە، نەک تەنها بۆ لای هەندێکتان.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: {لو كان أخي موســـى حياما و ســـعه إلا اتباعي} واتە: ئەگەر موســـى برام زیندوو بوایە ئەوا شـــوێنی من دەکەوت.

دەیـــەم هەلوەشێنەرەوە:ـ پشتکردن لە دینی اللَّه تعالی، کە نەشارەزای بێت و نە فێری بێت و نە کاریشی پێ بکات

وەک اللَّه تعالی دەفەرموو یت: {وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ}سورەتی السجدة ئایەتی٢٢

واتە: کێ لەو کەســـە ســـتەمکارترە کە بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ئـامۆژگـاریی دەکرێـت کەچی ڕوویـان لێوەرچەرخێنن..؟ ئەوانە تاوانبارن، بەڕاستی ئیمەش تۆڵە لە تاوانباران ئەسێنین، وە {مجـــرم}ـە کانیش لە ئاگردان، پەنا بە اللَّه..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:ـ {مـــن يرد اللَّه به خيرا يفـــقهـــه في ا لدين} واتە: هەر کەســـێک اللَّه تعالی خێری بۆی بو یت ئەوە لە دینەکەی خۆی شـارەزای دەکات، وە هەر کەسـێک اللَّه تعالی خێری بۆی نەویت ئەوە پشت هەڵدەکات و بێ ئاگـــا دەبێت لە دینی اللَّه.

جـۆرەکـانی {شـیرک } هاوبەشدانـان بـۆ اللَّه تعالی:ـ
دژی یەکخواپەرستی هاوبەشدانـان بۆ اللَّه {شیرک }
١ـشـیرکی گـەورە
٢ـشیرکـی بچـووک
٣ـشیـرکی شـاراوە
جــۆری یەکەم: لــە جۆرەکانی {شیرک} هاوبەش بڕیاردانی گەورە:ـ
ئـەم جۆرە شیرکـە اللَّه تعالی لێی خۆش نـــابێت و هیچ کردەوەیەکی چـاکیشی لێوەرنـاگرێت، خاوەنەکەی لە دین دەر ئەکات و تا هەتای لە دۆزەخ دەمێنتەوە، گـــەر بەردەوام نوێژ کات و بە ڕۆژو بێت و حەج کات و بگری و شـــەو نوێژکات و دوعا کات یەک شـــیرک گەورەی هەبوو هەمووی بەتـاڵ ئەبێتەوە وەک وابێ هیچـت نەکردوە هیچ، هەروەها ماڵ و خوێنی حەڵالە بۆ نمونە ئیستا پێغەمبەر ﷺ زیندو بوا یان کەســی حوکم بە قورئان ئەکات لەســەریتی هەر موشریکی ببینی بیکوژێت ڕەنگــە خەڵکی لای سەیربێت ئەلێ ئەوە نوێژەکە چۆن ئەی کوژی تۆش پێی بلێ ئەمە شـــیرکی کردوە بۆیە ئەم نوێژ و عیبادەتەی قبول نەبووە بەتاڵ بۆتەوە، اللَّه تعالی دەفەرمووێ چی موشریکە بکوژە، لای خەلک توندڕەویە ئەمە ، ئایە تـۆ بە ئایەتی اللَّه تعالی ئەلێت توند ڕەوی....!!
ئەی کێ دروســـتیکردوی بیرت کردۆتەوە تۆ بۆچی هاتوتە دونیا بۆ عیبادەت هاتی، وە {پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەرچی نەلێ لاإله إلااللَّه

نوێژ نەکا و زەکات نەدات ســەری لە لاشــەی لێ ئەکەمەوە جا لا إله إلا اللَّه مەبەســتی تەوحید کە ناوەڕۆکیت نەزانی زانســتت پێی نەبوو توشی شیرک ئەبی و تیا ئەچیت، ئەم شرکەی زۆربەی زۆری خەلک بێ ئاگایە لێ ڕەنگــــە با سی بکەی لای خەڵکی زۆر پێی سەیر بێت ئەلێ چۆن موشریکە ئەوە نوێژ ئەکا و ڕۆژوو ئەگرێت یان ئەلێ لا إله إلا اللَّه ئەبی بزانی اللَّه تعالی پێیان ئەلێ موشریکە و کافرە اللَّه تعالی لێی خۆش نابێت و شــوێنی ئاگری دۆزەخـــــە بەلگە اللَّه تعالی دەفەرموویت: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا}سورەتی النساء ئایەتی٤٨

واتە: بە ڕاســتی اللَّه تعالی خۆش نابی لەوەی هاوەڵ و شــەریکی بۆ بڕیار بدەیت جگە لەو هاوبەش دانانە لە گوناهانیتر بۆ هەر کەس بیەویت شایستە بێت و پەشیمان بێت خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریک و هاوبەش بۆ اللَّه تعالی بڕیار بدات، ئەوە بە ڕاســتی گوومڕا بووە بە گومڕایەکی زۆر دوور وە هەروەهـا اللَّه تعـالی دەفەرمووێـت: { لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ}سورەتی الزمر ٦٥

واتە: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شــەریک بۆ اللَّه تعالی بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کـارو کردەوەی چاکیشیان هەیە هـەمووی پووچ و بـێ نـرخ دەبێت.

بێگومان اللَّه تعالی لە موشریک خۆش نابێت ئەگەر تۆبەی نـــەکرد و مرد ئەوە شوێنی هەر ئاگری دۆزەخـە، ئەگەر پێش مردنیش تۆبەی لیَ بکات لێی خۆش ئەبێت.

شیرکی گەورەش چـوار جۆری هەیە :

١ _ هـــاوبەش بڕیاردان لــە پاڕانــەوەدا: کە عیبادەت بۆ غەیری اللَّه تعالی ، هاناو هاوار بۆ غەیری اللَّه تعالی ئەبن وەک سۆفی و دەروێش و تەریقەکان، هەمووی هاوار ئەکات یا رســول اللَّه یان یا خەوزی گەیلانی... هە تا دوای وەک بلیَ اللَّه تعالی ئە مانەی کردوە بە داوا لێکراو کە خەلکی داوایان لیَ بکات اللَّه تعالی ـش پێمان دەفەرموێت داوا لە هەر کەســی بکەی موشریکی لە غەیری اللَّه تعالی جا ئەم کەســە بمری و تۆبەی نەکردبی تا هەتای لە ئاگری دۆزەخ دەمێنتەوە هەروەها بەڵگەش اللَّه تعالی دەفەرمووێت {فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ} الحنكبوت ٦٥

واتە: هەر کاتیَ خەلکی باوەڕ لاواز ســواری کەشــتی ئەبن، مەترســی نـوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بە کوڵ هانـاو هاوارِ بۆ اللَّه تعالی ئەبەن بە دڵســۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتی اللَّه تعالی ڕزگاریان دەکات و دەگەنـە وشکانی دەستبەجیَ لە ڕیبازی یەکخواپەرســتی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ اللَّه تعالی بڕیار ئەدەن. ئەوانـە هەردەم هاناو هاوار بۆ غەیری اللَّه تعالی دەبەن.

٢_هاوبەش بڕیاردان لە نیـیەت و مەبەستدا:_ یانی تۆ نوێژ بۆ غەیری اللَّه تعالی بکەی مەبەســـت غەیری اللَّه بێت حەیوانی بۆ غەیری اللَّه تعالی ســـەر بڕ یت، قور ئان ئەخوێنی بۆ غەیری اللَّه هەرچی بکەی مەبەســـت بۆ اللَّه نەبێت ئەمەش شـــیرکی گەورەیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت {سێ کەس کە اللَّه تعالی ئاگری قیامەتیان پێ گەرم ئەکا یەکی ئەو پیـاوەی کە جیهـادی کردوە دێتە بەردەم اللَّه تعـالی پێی ئەفەرمووێ بۆ کوژرای ئەویش ئەلێ بۆ تۆ اللَّه تعالی دەفەرموو یت درۆ دەکەیت بۆ ئەوە شـەڕت کرد تا بلێن کوڕی ئازایە و چاو نەترسـە، دووەم بە دۆلەمەندەکە ئەفەرمووی ئەم مزگەوتەو بۆ دروستکرد ئەویش ئەلێت بۆ تۆ کردم اللَّه تعالی پێی ئەفەرموو یت درۆ دەکە یت بۆ ئەوە کردت خەلک بلێن پیاوە و باسی کەن بە باشە، سێیەم کەسی علم یانی زانستی پێیە خەلک فێر ئەکە پێی ئەفەرمووی لە پێناو کێ کردت ئەلێ لە پێناو تۆ اللَّه تعالی پێی ئەفەرمووی درۆت کرد بۆ وە کردت خەلک باســـت کات بە باشـــە، بۆیە نوێژ و قوربانی و هەموو شـــتێک ژیان و مردنمان بۆ اللَّه تعالی ـیە

بەلگەش اللَّه تعالی دەفەرمووێت: {مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ}سورەتی هود ئایەتی ١٥

واتە: هەر کەس تەنها ژ یانی دونیا و ڕازاوەیی و (خۆشـــگوزەرانی) یەکەی بوێت، ئەوە پادا شتی هەوڵ و کۆ شـشی ئـــەو جۆرە کە سانە دەدەینەوە لـە دونیادا، ئەونیش تێیدا هیچیان لێ کەم ناکرێت

٣_ هاوبەش بڕیاردان لە گوێڕایەلیدا:_ یانی گوێڕایلەی کەســی بکەی لە شـــتێ غەیری حوکمی قورئان بلێ نوێژ نەکە نای کەیت بلێ بمرە ئەمریت هەرچی پێ بلێ ئەی کات بۆ کەسەکە کەواتە دژی اللَّه تعالی وەستاوە و ئەم کەسەی پەرست و هاوەڵای پەیدا کرد بۆ اللَّه تعالی وە هەروەها اللَّه تعالی دەفەرموویێت: {اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِـــيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ}سوڕەتی التوبه ئایەتی٣١

واتـە: گـاورو جوو قەشەکانی خۆیـان کردۆتە پەروەردگـار، خـۆیان لە جیاتی خوا ملکەچ و فەرمانبەردار یانن، ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیـان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش ( بە کوڕی خوا دەزانن) لە کاتێکدا فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەستنی تاکە خوایەک، بێگوومان جگە لەم زاتــە خوایەکی تر نیە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە ئەو نەفامانە هاوەڵی بۆ بریار دەدەن.

وە تەفسیری ئەم ئایەتە هیچ گومانی تیدا نیە گوێڕایەلیکردنی زانایان و خواپەرستان لە شتێکدا کە تاوانــــە و بێ فەرمانییە،نەک داوایان لێ بکرێت هەر وەک پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی وا شـیکردۆتەوە بۆ عدي کوڕی حاتم اللَّه لێی ڕازی بێت، کاتی پرســـیاری لێ کرد وتی ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست،

پێغەمبەریش ﷺ بۆی باس کرد:_ کە پەرستنیان لە گوێڕایەڵی کردنیانە بـۆ سەرپێچییەکان.

٤_ هاوبەش بڕیاردان لە خۆشەویستیدا: ئەمەش ئەوەیە گەر تۆ بڕوات بە اللَّه تعـالی نـابی کەســێکیتر لەو خۆشــتر بوێـت، نـابی فەزلی بەرنامەیکیتر بدەی بەســەر بەرنامەی اللَّه تعالی، نابێت کەســێکت خۆش بوێت وەک اللَّه تعالی کە سێک بلێ نوێژ نـــەکە تۆش نـــای کەیت ئەوە کەواتە ئەو کەسـەی خۆشـتر ئەوی لە اللَّه تعالی ، چونکە اللَّه پێی فەرمووە نوێژ کە بەڵام ئەو بە گوێی کەســەکە ئەکات و نوێژ نـاکات، ئـەم دڵـە بەس بۆ خۆشەویستی اللَّه تعالی ـیە، کەسانی هەیە ئەوەنە کەسێکیان خۆشەویت ئەی کەنە شوێنی اللَّه تعالی پەنا بە اللَّه بەلگەش اللَّه تعالی دەفەرموویت: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ}سورەتی البقرە ئایەتی١٦٥
واتە: لەگەڵ ئەو هەموو بەلگە ئاشــکرایانەدا هەندیک کەس هەیە لە جیاتی ئەوەی خواپەرســت بێت، شــتانی تر دادەتاشــێت بۆ خۆی و شوێن ڕێنموویيەکانی خوا ناکەوێت، خۆ شەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو توولە ڕێگەیانە و خۆشـــی دەوێن، وەک چۆن ئیمانداران خوایـان خۆش دەوێت.

جۆری دووەم:_ لە جۆرە کانی شــیرکی بچووک ئەمە لە دین دەری ناکات بەڵام تاوانبار ئەبێت، کردەوە کانی هەموو بە تاڵ ناکاتەوە بۆ

نمونە کەســـی نوێژ ئە کات لەم کاتە یەکی دێت و تۆش نوێژەکەت جوان ڕێک دەکەی ئەوە بوە شـــیرکی ڕیا وە بەس ئەم نوێژەی قبول نابێت و شـــیرکی بچوکت ئەنجام دا ئەبێ ئاگادار بین بچوک نیە چونکە لە هەموو گوناهـــە گەورەکان گەورەترە تەنها لە شیرکی گەورە بچوکترە ئەمەش سـزای خۆی هەیە کە خاوەنەکەی بۆ هەتا هەتای لە دۆزەخ نامێنتەوە وەک شرکی گەورە ڕەنگە اللَّه تعالى نەشـــی خاتە دۆزەخ لێیخۆش بێـت بە کردەوەی خۆی چـاکەی زۆر یـان بەر شـــە فاعەتی پێغەمبەرﷺ بکەوێت بەلگە اللَّه تعالى دەفەرموویت: {فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَــالِحًا وَلَا يُشْرِــكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا} الكهف ١١٠ واتە: جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگار شاد بێت، بە خۆشنودیەوە با کارو کردەوەی چاک و دروست ئەنجـام بدات و بە هیچ شێوەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتـــە هاوەڵ و شەریک بۆی.

جۆری سێیەم: لە جۆرەکانی شیرک ، شیرکی شاراوەیە:_ ئەو شیرکەیە کە بێ ئەوەی بزانین لە دەمان دێتە دەرەوە هەیە ئەلێ من شـــەریک بۆ اللَّه بڕیار نادەم باشە جۆرەکانی ئەزانی..؟!

ئەبی بزانی تا شـــەیتان زاڵ نەبێت بەســـەرت، گەر شـــیرک گەورە یان بچوکت هەبی تۆبە ئەکەیت بەڵام شیرکی شاراوە نازانی کە شیرکت کردووە بێ ئاگای لە زمانت دەر ئەچی چۆن تۆبەی لێ ئەکەیت کە نازانی شیرکت کردووە..؟

## جۆرەکانی شیرک شارەوە

١ـ بلێیت گەر فلان کەس نەبووە ئەمە نە ئەبوو ئەمە شیریکی شاراوە بێ ئەوەی بزانین هاوەڵمان بۆ اللّٰه تعالی بڕیار دا پەنا بە اللّٰه.

٢ـ یان بلێت گەر ئەم خواردنەم نە خواردبا نەخۆش نە ئەکەوتم، چەند لە ئێمە ئاوانە ئەڵێین بێ ئەوەی بزانین ، چونکە اللّٰه نەخۆشمان ئەخاو هەر خۆشی شیفامان ئەدات وە دەرمانیش اللّٰه تعالی ئەی کاتە سەبەب تا شیفامان بدات.

٣ـیان قسە بە کات یان قسە بە گەرما و سەرما ، بە وەرزەکان ئەی کەن بە گاڵتەجاری ئەمانە شیرکی شاراوەیە ئەمەش پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: {الشرک في هذه الأمة أخفى من دبيب النملة السوداء على صفاة سوداء في ظلمة الليل } واتە: شیرک لە ناو ئەم ئوممەتەدا شاراوەترە لە شوێن پێی مێرولەیەکی ڕەش، لەسەر بەردێکی لووسی ڕەش لە شەوێکی تاریکدا.

جا وەرە ئەم شیرکە بدۆزەوە وە هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت کە فارەتەکەشی: { اللهم إني أعوذ بک أن أشرک بک شيئا و أنا أعلم، و أستغفرک من الذنب الذي لا أعلم }واتە: ئەی پەروەردگارا من پەنات پێ دەگرم لەوەی هاوبەش بۆ تۆ بڕیار بدەم لە کاتێکدا کە دەزانم، وە داوای لێخۆشبوونیشت لێدەکەم لە تاوانێک کە نایزانم.

## جــۆرەکـانی کوفر

کوفـر دوو جۆرە:ـ

>جــۆری یـەکەم :ـ کوفرێک لە ئیسلام پێـی دەردەچـێـت.

ئەوەش پێنـج جــۆرە:ـ

یــــەکەم جــــــۆر : کوفری بــە درۆزانیـــن:ـیانی درۆ بۆ اللَّه تعالی هەلبەســێت یان ئەوەی لای اللَّه تعالی هاتووە بە درۆی بزانی پەنا بە اللَّه بـەلگـەش اللَّه تعالی دەفەرموویت ( وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى اللَّه كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ) العنكبوت:٦٨ واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە لە سەر خــــوا درۆ هـەڵبـەسێ و هـاوبـەش و هــاوەڵــی بـۆ دادەنـێ؟ یـان بـاوەڕی بـەو قـورئانە هەقـە نەبێت کاتێ بۆی هات؟ ئـاخۆ بـۆ بـێ بـڕوایـان لـە دۆزەخـدا جـێ نیـە؟! واتـە: جـێ هەیـە لە دۆزەخــدا بـۆیان (بێگومان ئامــادە کراوە).

دووەم جـــۆر: کوفری وەرنەگـرتن و خـۆ بە گـــەورە زانیــن ( لــە ئــــاستی حەق) لەگــەڵ ئەوەشدا بڕوایان پێیەتی و بە ڕاستی ئەزانن، ئەمە بڕوای بە اللَّه تعالی بە پێغەمبەرﷺ بە مەنهەجەکە هەیە بەڵام ئەمرەکان جێبەجێ ناکــات

بـەلگـەش اللَّه تعالی دەفەرموویت ( وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ) البقرة:٣٤

واتــــــــە:_ ئەی پێغەمبەر! ئەوەدەمەیـــــــان وەبیر بێنە کە ئێــــــمە بەفریشــتـــــــەکانمان گوت: ســوژدەو کڕنووش بەرنە بەرئادەم ئینجا ئەوانیش دەســـت بەجێ کڕنووشـــیان برد ، شـــەیتان نەبێت ئەو سەرپێچیکردو خۆی بە گـەورە زانی و بوو بەیەکێ لەبێ باوەڕان.

سێیەم جــۆر: کوفری شک و گــومان:_یەقین بە شتەکان نییە گومانی لێ هەیە یەقین بە زەکات بە نوێژ بە ڕۆژی یەکی لەوانە نەبێت کوفری گەورەی کردوە، بـەلگـەش اللَّه تعالی دەفـەرمـــوویـت ( وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا(٣٥)وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا(٣٦)قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا(٣٧)لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا(٣٨)الكهف/٣٥/

واتە: ڕۆژێک چوو بۆ سـەردانی یەکێک لـــــە بـــــاخەکانی (لەگەڵ هـــاوەڵەکەیدا) لـــە کاتێکدا کە ستەمکار بوو لـــە خۆی ( بەهۆی لە خۆبایـی بونیەوە) بۆیە لەبەر خۆیەوە وتی: گـومان نـابەم کـــە ئەم باخ و باخاتە هەرگیر لە ناو بچێت، واش گومان نـــــابەم کە قیامەت بەرپا دەبێت، ســـوێند بەخوا گــــــەر بمگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارم دوای مردنم ، ئەوە دلنیام کە لای ئەویش جێگە و ڕێگە و جە ندە ها باخی ڕازەوەی لەمە باشترم بۆ ئامادە کراوە. هـاوەڵە ئیماندارەکەی لـە کاتێکدا گفتوگۆی لەگەڵە دەکرد پێی وت : ئایە باوڕت نە ماوە بەم

زاتەیی کە سـەرەتا تۆی لە خـاک دروسـت کردووە؟! لەوەودوا نـوقتەیەک بوویت، پـاشان کردتی بە پیاو؟!!
بـەڵام من دەڵێم کە اللَّه ( بەدیهێنەری هەموو بونەوەرە)، هـەر ئـەو پەروەردگارمە، هیچ جۆرە هـاوەڵ و شـەریکی بۆ ئەو پەروەردگارەم بڕیار نادەم.

چوارەم جـۆر: کوفری پشـت هەڵـکردن لـە دین:ـ جی پێ بلێی جێبەجی ناکات پشـتی هەلکردووە لەم دینە و خۆشـی فێر ناکات نایەوی وەلیگرێت، بـەلگەش اللَّه تعالی دەفەرمووێت: (وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّآ أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ) الحقاف:٣ واتە: کەچی بێ باوەڕان پشـت هەڵـدەکەن لـەو ئـاگاداری و بێدارکردنەوەیە.

پێنجـەم جـۆر: کوفری دووڕووی:ـ بە زمان شتێک بلێت و بە دلیش ڕقی لێ بێت ئەمە گەورەترین نەخۆشـیە ئەبێ زۆر ئاگادار بین اللَّه تعالی پەنامـان بـات، بـەلگەش اللَّه تعالی دەفەرمووێت: (ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ) المنافقون:٣
واتە: ئـەو بەدکاریەشیان هـی ئـەوەبوو کە بۆ یەکەمجار بـاوەڕیـان هێنـا، پـاشـان کـافر بـوونـەوە! ئیـتر مـۆری بەدبەختی نـرا بـەسـەر دڵـیـانـدا جـا ئـەوان تێـناگـەن وحـەقـیقـەت وەرنـاگـرن و وشـەو مـانـای خـێر نـازانن، واتە: چـاکو خراپ لەیـەک نـاکەنـەوە.

## جــۆری دووەم لـە جۆرەکانی کوفری

بریتیـە لــە کوفری بچـووک، کە ئیسـلام پێی نـاچێتە دەرەوە، ئەوەش کوفر کردنە بە بەخششی نیعمەتەکان.

بەلگەش اللّه تعالی دەفەرموویت: (وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْــنَعُونَ ) النحل:١١٢ واته; خوا نـموونەی خـۆشگوزەرانی و ئـاوەدانیـی شـاری (مـەککە) دێنێتەوە کە ژیانـیان پـڕ بـوو لە ئـاسوودەیـی و ئـارامش, کـەچی لەمـلاو لـەولای ئـەوانیـشەوە خـەڵک تاڵاندەکراو دەرفێنـران , پـاشـان کە پەیامبەریان ( ﷺ ) بۆ هـــات و, لەبـــاتی شوکـــرانە بـــژێـــریـــی، پشتـیـان تێـکردو دڵیـان ئـێشـان، ئینـجا خـوای بـاڵادەست جـۆراو جۆر جـەزرەبەی دان و لێـی تێکدان لەهەموولایەکەوە ڕزق و ڕۆزیی و نیعمەتی زۆرێـان بۆ دەهـات کەچی لەبـاتی شـوکرانە بژێـرێـی لـەبـەرامبـەر ئـەو هەمـوو گشـت چـاکەوە ناسوپاسی نیعمەتەکانی خوایانکردو، باوەڕیـــان بـــە پێغەمبەرەکەی ﷺ نەکردو چوون بەگژیا جا خوایش جل و بـەرگی برسـیەتـی و تـرسی لـەبەرکردن و تاڵاوی پێچێژین، پاش ئـەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوعـای لێکردن و فـەرمـووی: خودایە ! داوات لێـــــدەکەم: ساڵە قات و قڕەکانی سەردەمی یو سف

ـیان بەسەر بێنە، ئینجا گرانیـەکی وایان تێکەوت، بەناچاریی کورکی وشتریان تێکەڵی خوێن دەکردو لەسەر ئاگریان دەناو دەیانخوارد !

❖ئــەم خاڵــە بە سوودانەش بزانە:
١_ شـیرکی گـەورە:_ ئـەمەش بـەرزتـریـنـیـانـە پێویستە دوور کەوێنەوە لێی چونکە باسمان کرد کە خاوەنەکەی بۆ هەتایـە لـە دۆزەخ ئەمێنتەوە و مال و خوێنی حەلالە

٢_شیـرکی بچـووک :_ ئــەمە لـە شـیرکی گـەورە بـچووکترە بــەڵام لــە تــاوانــە گــەورەکـان گــەورەترە، باسمان کرد کە لە دین نای باتە دەر بە قەد شیرکی گەورە نییـە.

٣_ تــاوانــە بچــووکەکان :_ هــەموو ئـەو تــاوانـانە دەگرێتەوە کەوا شـەرع حــەرامی کردووە بــەڵام سـزایـەکی تـایبەتی بـۆ دانەنــــاوە، ئــەم تاوانە بچوکانە بە کەم سەیری مەکەن چونکە هەر تاوانێکی بچوکە زۆر ئەبێت و ئەبێتە تاوانێکی گەورە.

٤_ تـاوانـە گــەورەکان :_ هـەموو ئـەو تـاوانـانە دەگـرێتەوە کە سـزایــەکی تــایبەتــی بــۆ دیــاری کراوە وەکو لــەعنــەت یــان دوورخستنـەوە ( دەرکردن ) یــان بـەریـبوون لــە بـکەرەکەی یــان

ئـەو یـەکێکە لــە مـوشریکەکانی یــان لـە ئیمــانداران نیـیـە یــان چـواندنی بـە نــابوترین ئـاژەڵان....

ـ پلــەکانی : جیـاوازن ، بـە بـەلگــەی ئــەو فـەرموودەیەی کە پێغەمبـەری اللَّه ﷺ دەفـەرمـوێت: ( أکبـر الـکبـائـر....)
واتـە:ـ گـەورەتـرین تــاوانـە گــەورەکان...)

ـئـامۆژگـاری لە خوشکی بچووکتان وەرگرن، هەر کەسێک کاتێک دوعــای کرد لە هەر کاتی بیری بێت و بلێــت یارەبی لێم خۆش بە و لە شیرک بم پاریزە وە لە هەر شیرک و گوناهی لە دەم دەرچووە بیرم نای و ئاگادار نیم لێم خۆش بە لە گوناهی گەورە و بچوک، لە هەر گوناهی بە ئاشــکراو شــارەوە ، یارەب ســتری کە لە دونیا و قیامەت بۆمم، داوای هیدایەت کە داوای دینی پاک بکە لە پێناو اللَّه تعالی شارەزای بیت ، هەمیشە تۆبە بکـــــە پێش ئەوەی بمری و قسەی لە دەمت دەرچوو بێ و نەت زانیبی یان گوناهێکت کردبێ و بیرت چوو بێت تۆبەی لێ کەیت، تــۆبە کـە هەمیشە نوێژی تۆبە کە ئامۆژگاریم بــــۆ ئێوە دونیا زۆر کـــــاتیە نازانین کەی ئەمرین ژیانی ڕاستەقینە دوای مردن دە ست پێ ئەکات ئیستا ئیمە بۆ عیبادەت هاتوینەتە دونیا تاقی دەکرێنەوە، هەوڵدە فێری زانســـت و زانیاری بیت و کرداری پێ بکە هەمیشـــەش یادی اللَّه تعالی بکە تا دڵ و دەرونت فراوان بێت

چونکه دڵ و دەرون بەس بە یادی اللَّه تعالی دڵخۆش و ئاســـودە ئەبێت، قورئان و فەرموودەش پشتگوێ مەخـــە هەرگیز، با درێژەی پێ نەدەم اللَّه تعالی لە ئاگری دۆزەخ بە دورمان خات و لە شـــیرک و گوناهـــــــ بمان پارێزێت و هەروەها لە هەمووومان ڕازی بێت لە کەم و کورتیشم ببوورن.....❝

_دوعا لـە بیر مـەکـەن..!!